# ناسنامەی کتێب:...

ناوی کتێب:ئای بۆ خەونزارێک[1]

بابەت:چیرۆک

نووسینی:سەربەست عومەر مەمەندی

ساڵی بڵاوکردنەوەی :٢٠١٨

تەنیا بەشێوەی پەرتووکی ئەلیکترۆنی بڵاوی دەکەینەوە.

[1] وشەکە لە چاوزار وەرگیراوە ، چۆن چاوزار بۆ خۆپارستن لە چاوی پیس بەکاردێت ، خەونزاریش بۆ مەبەستی خۆپارستنە لە خەونی خراپ بەکارهێنراوە .

- سەیرە ! دەبێ کێ بێت ؟

- چـۆن نازانی کێیە ؟ برالە ؛ سەیری خاڵی ڕوومەتی بکە .

- تۆش سەیری هاا کەسێک کە ون بوو ، ناسینەوە بەهۆی ڕووخسارییەوە دەرناکەوێ ، چونکە ئەوان زوو زوو دەبن بە سەراب.

- چۆن ؟!!!

( بیرم دێ ، تەمەنم چوار دە ساڵێک دەبوو ، باوکم بە دەم کێشـانی جـگەرەوە ، شـەوی بە ڕێ دەکـرد ، زوو زوو بـانگمی دەکـرد ، تـا کیسـی تـووتنەکەی ، لای دایکـم پـڕ بکەمەوە . پەڕە جگەرەی لوول دەدا ، بە پەنجە گرژەکانی تـووتنی دە ئـاخنیە نـاوی ، تـا خەو دەیبـردەوە ، مـژی لە جـــگەرە دەدا و دووکەڵ لە کـــونە لـــووتی دەهـــاتە دەر ، ژوورەکە قانـگ دەدرا. سـەیرم پـێ دەهـات ، ئەو هەمـوو جگەرەیە ، لەگەڵ چایە دیشلەمە ڕەنگ قیرپەکەی ، لە پای چـی ؟ ئەو گۆشـەگیرییەی لە پێنـاو چـی ؟ ئەوەی سەراسیمای دەکردم ! خامۆشکردنی جـگەرەکەی بـوو ، بەر لەوەی بیخاتە ناو تەپـڵە ڕەساسـیەکەی بەردەمـی ، سـەری

جگەرەکەی لەسەر نینۆکی پەنجە گەورەی قـاچی دا دەنـا و پاڵەپەستۆی دەخستە سەر تا بە تەواوی خـامۆش دەبـوو ، ئەو کات فڕێی دەدایە ناو تەپڵەکە ، خوویێکی گەنجـی بـوو بـۆی مـابوویەوە ، ئەت گـوت هەرچـی سـۆتەکی جـگەرەیە خزێنـراوەتە ژێـر نینۆکەکـانی ، ئـاوا نینـۆکی ڕەش ببـوو . داپیرەم ، چەند مانگێک دەبوو ، وەفاتی کردبوو ، زۆر جار باسی گەنجییێتی باوکمی بۆ دەکردم ، بە گوێرەی قسەکانی بێت ، گەنجێکی ئاڵۆز و خێر لەخـۆ نەدیـوو بـووە . تەنهـا منالێک ، کە هی ئەو پیاوە ئاڵۆزە بێت ، من بووم ، جگە لە خوشکە کۆچکردووەکەم ، تەمەنـی بەرەو پێـنج سـاڵی هەڵـکشابوو . ئێوارەیێـک ، دەنگـی قیـژە و هـاوار ، کێشـی کردمە ناو باخـــەکە ، تەنیـا تـولە ڕێـیەک لە خانووەکەمـانی جیای دەکردەوە ، بینـیم دایکـم لەسـەر خـۆڵکە کەوتـووە ، گریانە بە کوڵەکەی ، ناخمی دەهەژاند ! هاوسێکان لێی کۆ ببونەوە ، خەریکی ئارام کردنەوەی بوون . ئەوسا زانیم کە خوشکەکەم ون بووە !!! پشتی گەڕانێکی زۆر . خۆر بەرەو پشـوودان دەڕۆیشـت ، تـاریکیش بـاڵی بەسـەر ئاسـماندا دەپۆشـی ، خەفەتـیش ئـێمەی دادەپۆشـیەوە . تەرمـی خوشکەکەمیان لە چەمی خوار باخەکە دۆزییەوە!

لەگەڵ ئەو ڕووداوە ، شتەکان ئاڵـۆزتر بوون ، چونکە هەر چەند مانگێک دەبوو ، نا نا ، ساڵێکی ڕەتدابوو ، لە بەیانیـێکی تەمومژی کۆتایی پایزدا ، باوکم ماڵی جێهێشت و نەگەڕایەوە .

لە لادییێکی چەند ماڵی دا ، لە ماوەییێکی کەمدا ، هەم باوکم و هەم خوشکۆڵەکەشم لەبەر چاومان ونبوون و نەگەڕانەوە!

خوشکۆڵەکەم ئافرێنەری خۆشیمان بوو ، ساڵێک لە تەمەنی ڕەتدابوو ، زۆر جار بە گاگۆڵە دەهاتە بەردەمم ، ئامێزم بۆی والّا دەکرد و بەرزم دەکردەوە ، موددەتێک فێرببوو ، پەنجە باریکەکانی لە خاڵی ڕوومەتم دەخشاند ، هەوڵی لادانی دەدا ، جار جار ، شوێنی نینۆکەکانی لەسەر لا ڕوومەتم بە ئاشکرا بەدی دەکرا ، بەلّام هەر زوو شوێنەکەیان ڕەش دەبوویەوە .

دوای ئەوان . ئازاری ژیان ، خەفەتی ڕۆژگار ، جێ پەنجەی خۆیان لە ڕووخساری دایکم جێهێشت . خەریک بوو ، لۆچی پیری سەر بێننە دەرێ ، ڕوومەتەکانی

چووبونەوە یەک , ڕووخساری بەرەو مەیین دەڕۆیشت و سست دەکرد .

نە مێخەکە moorو شینەکەشی لە مل مابوو ، وەک چاوزارێک لەسەر جلە شۆڕەکانی ڕەنگی دەدایەوە ، نە ئەو ڕووخسارە گەشەشی مابوو . کە لە وێنەی ناو باولە شینەکە ، چەسپ کرا بوو ، گەنجییێتی دایکمی نیشان دەدا . جار جار سەیریم دەکرد و لەگەڵی پێ دەکەنیم ، لەگەڵ هەر سەیرکردنێک ، ئارامی پێ دەبەخشیم . دەمتوانی لەگەل هەر لۆچێک پێناسەییێکی جیاواز بۆ مرۆڤ و ژیان بکەم . یان بۆ تەمەنێک ، کە گوم بوونی ئازیزییێک چی بەسەر ڕووخسار دێنێ !

تاکە لێکچوونی نێوان من و باوکم ، خاڵی ڕوومەتمان بوو ، بیرمە کاتێ ڕۆیشت ، هۆکارەکەم لا ڕوون نەبوو ، یان وەک ئێستا فامم نەدەکرد . لە بەردەم ، ئاوێنە درز بردووەکەی ، سەر پەنجەرە ژەنگ گرتووەکە ، سەیری خاڵەکەمم دەکرد . بەڵام بە بەراورد بە ئێستا قەبارەی زۆر جوایەز بوو . ئەو کات ، هەر لە دەنکە ماشێک دەچــوو .

ئەوەی زۆر بەلامەوە سەیر بوو ، باوکم کیسەی تووتنەکەی لەگەڵ خۆیدا نە بردبوو . کیسەییێکی دەست چن بوو ،

دایکم بۆی چنی بوو ، تەنانەت گوڵێکیشی لەسەر نەخشاند بوو ، بەڵام ئەوەی سەراسیمای دەکردم ، ڕەشی گوڵەکە بوو ، تا ئەو کات ، جگە لە گوڵی فرە ڕەنگ ، زۆربەیان کەوتبوونە بەر دیدەنم ، ڕەشی لێ دەربچێ ، نەمبینی بوو. لادێیەکەمان بەهاران دەشت و دەر ، دۆڵ و گردۆلکەی ، سەرووی ماڵەکەمانی بە گوڵی سروشتی و گیای بەهاری دادەپۆشی.

بەیانیانێکی زۆر لەگەڵ هەڵسانم لە خەو ، سەیری دەستەکانم دەکرد ، لاچکی کیسەکەم لە دەست ئاڵا بوو ، ئەو کات بیرم دەهاتەوە ، بەر لە خەوتن بە دەستمەوە بووە ، لە کپی و خامۆشی ماڵەکەمان ، خۆمم پێی خەریک کردبوو .

جاران تامەزرۆی هاتنی پایزم دەکرد ، چاوەڕیی ڕووتبوونەوەی درەختەکانم دەکرد ، گەڵا زەرد بووەکان ، هەنارە شەق بردووەکان ، جوانییێکی زۆریان بەخشی بووە باخەکەمان . بەڵام لەگەڵ ئەو پایزەیی باوکم تێیدا گوم بوو ، ئیتر حەز و چێژ بینینم خاڵی بوونەوە .

دوای ئەو ڕووداوانە ، باخەکە بە تەواوی فەرامۆش کرا ، ناچار بووین یان دەبێ کەسێک بە کرێ بگرین ، یان بیفرۆشین.

شەوانێکی تەڕ و تووش ، لە پشتی ڕووداوەکان ، بە دەنگی دایکم دەهاتمەوە هۆش، چونکە هاوسەفەری ڕێگا نادیارەکەی باوکمم دەکرد، خەونی سەیر سەیرم دەبینی. ئارەق لەشمی تەنی بوو ، جلەکان بە لەشمەوە نووسابوون , بیرم دەکردەوە و لەگەڵ خۆما دەمگوت تۆبڵێی خەونم بینیبێ یان ڕێگاییێکی دوور و درێژم بڕیبێ ئاوا هیلاک بوومەوە و لە ئارەق غەرق بوومە .

- خەوی تۆش وەک هی چەند ساڵ بەر لە ئێستای باوکت لێهاتووە ، لە خەوا قسەی سەیر و عەجیبت لە دەم دێنە دەرێ ، باوکت بەردەوام باسی ڕێگاییێکی تەم گرتووی ، ڕێ لێگراوی دەکرد!!!

لەگەڵ ئەو قسانەی دایکم ، هەناسەم بۆ نەدەدرا ، هەستم بە لەرزێک دەکرد ، تا بەیانی نەمدەوێرا چاو بنوقێنم ، چونکە ئەو خەونەی دوای ڕووداوەکان وازی لێنە دەهێنام ، هەمان خەونی باوکمە !

چەند ڕۆژێک تێپەریکرد ، ترسی زۆرم ، لە قسە و ڕەفتاری دایکم ، هەست پێ دەکرد . ماوەییێک دەبوو ، کەشی شەوان هەر لە هی زستان دەچوو ، ئێواران زۆر جار خەریکی دار و چیلک ، کۆکردنەوە دەبووم ، زۆپاکەمان پێ گڕ دەدا ، ئاگردانەکەمان پێ جۆش دەدا ، ڕۆژانیش چای دوای فراڤینمان پێی لێدەنا .

شەوێک لە شەوەکان بەر لە خەوتن ، دایکم دوو سێ جار ، هەوڵی درکاندنی شتێکی دەدا ، بەڵام نەی دەتوانی بێتە گۆ ، شەوێکی تووڕە و بەهێز بوو ، باییێک هەڵی کردبوو ، خەریک بوو ، دەرگا و پەنجەرە بە نایلۆن داپۆشراوەکەمان لەبن هەڵکەنێ و لەگەڵ خۆیا بیبا ، هاش و هووشەکەشی نەیدەهێشت کەس بخەوێ ، جگە لە بروسکە لە پڕەکانی ئەو شەوە ، لەگەڵ هەر بروسکەیەک ڕووخساری دایکمی ڕووناک دەکردەوە و لۆچێکی نوێم تێیدا دەدۆزیەوە .

- دایکە چیتە ؟ دەتەوێت چیم پێ بڵێی ؟ سەیری دەکردم ، هەستم دەکرد ، لە خاڵی ڕوومەتم ورد بۆتەوە .
- هیچێ ، بەس .
- بەس چی ؟

- ئایا ؟ تا ئێستا هۆکاری مردنی خوشکەکەت ، ون بوونی باوکت زانیووە ؟!

تەسەوری قسەی وام نە دەکرد ، بۆیە بە واقورماویەوە ، هیچم بۆ نەگوترا ، تا خۆی دەستی پێ کردەوە .

- زۆر دەترسم !
- لە چـــی ؟ دایکە گیان ؟
- دەترسم تۆشم لێ بڕفێنن !
- دایـــکە ، توو خــودا ، مەبەستت چیە ؟ تێمبگێنە.

- ڕۆڵەکەم ، دوای چەند ساڵ ، هاوسەرگیریمان ، خۆشی و ناخۆشیمان ، تێدەپەڕاند . بەڵام چەند هەفتەیەک ، بەر لە ون بوونی باوکت ، نەی دەتوانی بخەوێ گەر بشخەوتبایە ، بە دەنگ و هاواری خۆی خەبەری دەبوویەوە ، هەر دەیگوت : دەترسم .... دەترسم !

باسی ڕێگاییێکی دەکرد ، درەختێکی سووتا و تەنیا شێوەکەی مابوو ، کە هەر لە لاشەی مردووێک دەچوو ، بێ

بەر و بێ گەڵا ، تەنی داپۆشی بوو ، لە ناوەڕاستی ڕێگایەکە ڕووا بوو . قەڵە ڕەشێکی سست ، لەسەر لقێکی درەختەکە بوو ، کە پێ دەچوو ، لەگەڵ سووتانی درەختەکە ، پەڕەکانی هەمووی هەڵبزووركابن ، نەیتوانیبێت بفڕێت . وەک خۆی باسی دەکرد ، پشتی درەختەکە شتێکی لێبوو ، کێشی دەکرد ، بێ ئەوە بزانێ چیە ؟ بەڵام هەرکاتێک نزیک درەختەکە دەبوویەوە تا بزانێ چی لە دواوەیە ؛ بە خەبەر دەهاتەوە .

ئەو ڕۆژەی باوکت تیایدا ون بوو ، بەیانیەکەی هەمان خەونی دیبوو. کە ئێوارە بۆ کارێک ڕۆیشتە دەر ، بەر لە دەرچوونی بانگی کردم

- بۆم دەرکەوت ، چی لە پشت درەختی ، خەوەکەمە !
- چیــە ؟

هیچ وەڵامێکی نەدامەوە ، تەنیا وشەیێکی درکاند

- ئەویش ڕەش بوو !!!

هەنگاوی نایە بەردەمی ، بەر لە دوا هەنگاو ، سەیرێکی کردم ، بۆ هەمیشە ون بوو .

هەندێ لە ترسی دایکمم بۆ ڕوونبوویەوە ، فرمێسک لە هەردوو چاوەکانی هێدی هێدی ، ئەتکانە سەر گۆنە پڕ لۆچەکانی ، هەناسەمی سوار دەکرد ؛ درێژەی پێ دایەوە.

- خوشکەکەشت ، لەو تەمەنە ، خەون وازی لێ نە دەهێنا! ئەو جارەت بیرە ، باخچەی هاوسێکەمان گڕی گرت و بەشێکی زۆری خانوەکەشیان سووتا بوو ؟

نەیهێشت ؛ بە بەڵێ یان نەخێر وەڵامی بدەمەوە و درێژەی پێ دایەوە .

بەیانیەکەی ڕۆیشتین ، بۆ سەیرکردن و یارمەتیدانیان ، خوشکەکەت کە درەختە سووتاوەکانی بینــی ، ڕووخساری ڕەنگی بەفری لێ نیشت ، نیشانەی ترس لە ڕەفتارەکانی بە ئاشکرا هەست پێدەکرا ، ئەو کات زانیم ، خەونی خوشکەکەشت هەر هی باوکتە . شەوانی لێ تاڵ کردبوو ، نەیدەتوانی ، چاوەکانی بنوقێنێ ، هەڵئەلەرزی و دەی گوت دایـــە : دەترسم ، ڕامدەکێشن !

کوڕەکەم , بۆیە دەترسم , تۆش ون بی ، وەک ئەوان !

تا بەیانی لە قەراغ پەنجەرە ژەنگ گرتووەکە تاسابووم ، ببوم بە پەیکەر . کیسەی توتنەکەم هەر لەلا بوو . ئەو کاتانەم دەهاتنەوە یاد ، بە دزی باوکمەوە ، هەوڵی پێچانەوەی جگەرەم دەدا ،لاسایی ئەوم دەکردەوە ، بەڵام وەک ئەو ، نەم دەتوانی . تەنانەت جارێک بەهەر شێوازێک بوو ، هەندێک تووتـنم ئاخنیە ناو پەڕی جگەرەکە ، وەلێ تا لوولم کرد و خستمە سەر لێوم ، نیوەی توتنەکە ڕژایە سەر شەرواڵە خاکیەکەم ، دەنکی شقارتەکەم گرڕدا و لە دەمم نزیک کردەوە ، تەقەی دەرگا نەیهێشت جگەرەکە دابگرسێنم ، لە ترسان دەنکە شقارتەکەم لە دەستە لەرزۆکەکانم کەوتە خوار و کونێکی خستە شەرواڵەکەم ! ئەو کات زانیم ، باوکم چ تەمەنێکی بە پێچانەوەی جگەرە بەسەر بردووە ، چ خەمێکی لە بری توتن ئاخنیوەتە ناو پەڕەکان و کردوویـێتیە دووکەڵ ، تۆ بڵێی چ ئاواتێکی ڕێسی بێت و لێ بووبێتە خوری .

ئەوەی بەلامەوە سەیر بوو ، دەبێت چ هاوبەشییێک لە نێوان ، گوڵە ڕەشەکە ، درەختە سووتاوەکە ، قەلەڕەشەکە ، خاڵە ڕەشەکەی ڕومەتمان و تەنانەت نینۆکە ڕەش بووەکەشی هەبێت ؟ ئەی ئەو ، شتە ڕەشـە , چیە ؟ لە پشتی درەختەکە خۆی مەڵاس داوە ، بۆ هەموویان ڕەش ؟

لەبەر خۆمەوە دەمگوت : بڵێی وەک چاو زارەکەی دایکم ، خەونزارێکیش نەبێت ؟ تا لەو خەونانە ڕزگارمان بکات و بمانپارێزێت .

دەمەویست زووتر بەیانی دابێت ، تا هەر هیچ نەبێ جارێ هۆکاری چنینی گوڵە ڕەشەکە لە دایکمەوە بزانم . حەزم دەکرد ، قۆڵبەستم بکەن ، نەهێڵن جولە بکەم ، چونکە لە پڕ هەستم بە هەمان کێشی خەونەکە دەکرد ! خەریک بوو شتێک کێشم بکا بۆ شوێنێکی نادیار ! بەس تۆ بڵێی ڕۆژێک دایکیشم ، هەمان خەون ببینێ و بیهێننە لامـــان ؟)

بە لێڵی شتەکان دەکەوتنە بەر دیدەنم ، چاوەکانم بەتەواوی هەڵنەدەهات ، بۆنی سووتاویش لە نێو پێخەفەکە پەلکێشی کردمە دەرەوە ، لە ئاشبەزخانە قرچە قرچی شت سوورکردنەوە دەهات ، هەنگاوم نایە ژوورێ ، تاوە دەسک دارەکە لەسەر ئاگر دانراوە،بینیم شتێکی ورد کراوە لەنێو تاوەکە بۆتە ڕەژوو ئەوەندی بمێنێتەوە لەناو تاوەکەیا ، بە بۆنەکیا زانیم پیازە ! بەخێرای ئاگرەکەم کوژاندەوە . هیچکەس نەدەنگی هەبوو ، نەڕەنگ ، نەمدەزانی دایکم ، خوشکۆڵەکەم لە کوێن ؟ ڕۆیشتمە ژوور بە ژووری خانووەکەمان بەڵام کەس نەبوو ، سەیری کاتژمێرە شوشە

درز بردووەکەی دیوارەکەم کرد بەڵام چرکە ژمێرەکەی نەدەجولا ، پێدەچوو موددەتێک بێت وەستابێت ، لەپڕ بیرم بۆسەر بەروارەکەی سەر دیواری بەرامبەر چارپاکەم ڕۆیشت ، کە ڕۆژانە یەکەم کارم دوای هەڵسانم لەخەو ، خەتێکم بەسەر ئەو ڕۆژە دادێنا کە تێدەپەڕی،بەروارەکە وێنەی یاریزانێکی تۆپیپێ بوو ، تۆپێکی ئاڵتونی بەدەستەوە گرتبوو، جاران دایکم زوو زوو دەیگوت

- ئەرێ ڕۆڵە ئەوە چیە لە دەستی؟
- تۆپی ئاڵتوونیە .
- تۆبڵێی بیفرۆشێ چەند پولی دەست کەوێ ؟
- دەمدایە قاقای پێکەنین و لە خۆشیانە چاوم ئاوی دەکرد .

بەچەند هەنگاو و نیوێک گەیشتمە بەردەم بەروارەکە سام گرتمی ،لەشم ئارەقێکی ساردی کرد ، بینم هەموو ڕۆژی بەروارەکە خەتی بەسەر کێشراوە ! ئای چ سەختە مرۆ تەنیابێت و نەزانێ لە چ ڕۆژێک و مانگێک و ساڵێکە ، تەنانەت نەزانێ چ کاتێکی ڕۆژە ، شەوە یا ڕۆژ !

**هێواش هێواش سەرم گێژی دەخوارد ، بیرم دەکردەوە ئەوەی بینم خەون بوو، یا ڕاستی؟**

**باشە من لەکەی یەوە خەتووم و چۆن هاتوومەتەوە ماڵەوە؟**

**کۆتایی .**